# عیشق

بۆ لەبەرکردنی سوورەتی الصف

ئامادەکردنی : تەنیاحاجی





بابەت: ئاینی

ئامادەکردنی: تەنیاحاجی

دیزاین: تەنیاحاجی

چاپ: یەکەم

ساڵی: ٢٠٢٣

بڵاوکراوەی: چەناڵی تیلیگرامی تەنیاحاجی



# پێشەکی:

بەناوی خودای مەزن و میهرەبان , درووسکەری گشت جیهان و بوونەوەران , ئەم کتێبە خنجیلانەیە و بچووکە پێشکەش بێت بە هەر دڵێک کە بیەوێت بە یادی خودا ڕۆشن و ڕازاوەی بکات , سوپاس بۆ خودا دوای چەند کاتژمێرێک توانیم ئەم کتێبە ئامادە بکەم بۆ موسوڵمانان تاوەکو بتوانن بە ئاسانترین شێوە سووڕەتی الصف لەبەربکەن و لێی تێبگەن بەتایبەت لەم کاتەدا کە برایانی موسوڵمانانمان لە فەڵەستین خەریکی جیهادن , ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستانیش بۆ پشتیوانی هەڵساون بە ئەنجامدانی پرۆژەیەک وەک پاڵپشتی برایانمان , لە دڵەوە نزا دەکەم خودا موسوڵمانان سەربخات و خۆڕاگریان پێ ببەخشێت دژی ئەو ستەم و زوڵمەی لێیان دەکرێت , ئەم کتێبەش بۆ من بکات بە تێشووی قیامەت و سڕینەوەی تاوانەکانم.

# ئاگاداری:

ئەم کتێبە تەفسیری سۆرانی و بادینی لەخۆگرتووە.

بۆ سۆرانی تەفسیری ( پوخت و ئاسان و ڕامان ) بەکارهاتووە.

بۆ بادینی تەفسیری ( سەناهی ) بەکارهاتووە.

لە تەفسیری سۆرانی ئەوەی ئاسان بووبێت بۆ تێگەیشتن دانراوە...!

# تێبینی:

**ئەم کتێبە موڵکی نووسەر و موسوڵمانانە , هەر لایەنێک یان دەزگایەک یان ناوەندێک و چاپخانەیەک هەڵسێت بە چاپ کردنی بەبێ ئاگاداری نووسەر و بۆ سوود و قازانجی خۆی , تووشی سزای یاساى دەبێتەوە و غەرامە دەکرێت و تۆمەتبار دەکرێت بە دزیکردن , بەبێ ئاگادرکردنەوەی خاوەنەکەی هیچ کەسێک بۆی نییە بازرگانی بە کتێبەکە بکات.**

## بۆپەیوەندی کردن بە خاوەن کتێب

## وێنەی ئەم بارکۆدە بگرە لە گۆگل:



# زانیاری:

سوورەتی (صەف) (واتە: پۆل)
سوورەتێکی مەدەینەیە و (١٤) ئایەتە

(عبدالله ی کوڕی سەلام) دەفەرمێت: رۆژێك لەگەڵ هاوەڵان وتمان کێ دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری لێبکات خۆشەویستترین کردەوە لای خودای گەورە چییە تاوەکو ئەنجامی بدەین ؟ کەس نەڕۆیشت پێغەمبەری خودا - ﷺ پیاوێکی نارد بۆ لامان هەموومانی کۆکردەوەو خوای گەورە ئەم سوورەتەی دابەزاندو پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو سوورەتەکەی بەسەرماندا خوێندەوە .









سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ
وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (1)

سۆرانی:

**هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بەپاکی و بێگەردی یادی خودایان کردووە، هەر ئەویش باڵادەست و دانایە.**



بادینی:

**هەر تشتەکێ ل عەسمانان وعەردی خودێ ژ هەر تشتەکێ نە بابەتی وی بت مەزن وپاك كرییە، وئەوە زالێ کەس نەشێتێ، یێ کاربنەجهـ د گۆتن وکریارێن خۆ دا.**







يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ (2)

سۆرانی:

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێک دەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟



بادینی:

ئەی ئەوێن باوەری ب خودێ ئینای ودویکەفتنا پێغەمبەرێ وی کری، بۆچی هوین سۆزێ ددەن، یان گۆتنەکێ دبێژن وپاشی هوین پێگیرییێ پێ ناکەن؟ وئەڤە ئاشکەراکرنە بۆ خرابییا وی کەسێ گۆتن وکریارێن وی وەکی یەك نەبن.







كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ (3)

سۆرانی:

**زۆر مایەی ڕق و توڕەیی یە لای خودا کە قسەیەك بلێن کردەوەی پێ نەکەن.**



بادینی:

**ل نك خودێ کەرب ونەڤیانەکا مەزنە هوین وی تشتی ب دەڤێ خۆ بێژن یێ هوین نەکەن.**







إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا
كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ (4)

سۆرانی:

بەڕاستی خودا ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە دەجەنگن لەپێناو ڕێبازی خوادا بەیەك ڕیزو یەك پارچە و یەك دڵ، وەک کۆشکێکی بەرزی قایمی داڕێژراون بە قوڕقوشم.



بادینی:

هندی خودێ‌یە حەز ژ وان دکەت یێن ڕێز ڕێزە شەڕی د ڕێکا وی دا دکەن هەر وەکی ئەو ئاڤاهییەکێ موکم وپێکڤە گرێدایینە یێ دوژمن تێ نەبۆرت. وئەڤ ئایەتا خێرا جیهادێ وجیهادکەران بەرچاڤ دکەت؛ چونکی خودێ حەز ژ وان بەنییێن خۆ دکەت یێن شەڕی د ڕێکا وی دا دکەن، وڕێز ڕێزە بەرانبەر دوژمنان ڕادوەستن.





وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ
إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ (5)

سۆرانی:

**بیربکەرەوە کاتێك کە مووسا بە گەلەکەی وت ئەی گەلەکەم بۆچی ئازارم دەدەن لە کاتێکدا بێگومان دەزانن کە من نێردراوی خودام بۆ لای ئێوە هاتووم جا کاتێك لایان دا لەهەق خوداش دڵی وەرگێڕان وە خودا ڕێنموویی گەلی لەڕێ دەرچوو ناکات.**



بادینی:

**دەمێ مووسا گۆتییە مللەتێ خۆ: بۆچی هوین ب گۆتن وکریار نەخۆشییێ دگەهیننە من، وهوین دزانن کو ئەز پێغەمبەرێ خودێمە بۆ هەوە؟ ڤێجا دەمێ وان بەرێ خۆ ژ ڕاستییێ وەرگێڕای پشتی وان زانی، وڕژدی ل سەر وێ چەندێ کری، جزایێ وان خودێ دلێن وان ژ قەبویلکرنا حەقییێ وەرگێڕان؛ ژ بەر کو وان سەرداچوون بۆ خۆ هلبژارت. وخودێ بەرێ وی مللەتی نادەتە هیدایەتێ یێ بێ ئەمرێ کری و ژ ڕێکا حەق دەرکەفتی.**







وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ (6)

سۆرانی:

بیریان بخەرەوە، کاتێك عیسای کوری مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە، ڕاستی تەوڕاتیش دەسەلمێنم کەلە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بەپێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە، کەچی کاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواو و موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.



بادینی:

وتو بۆ مللەتێ خۆ بێژە دەمێ عیسایێ کوڕێ مەریەمێ گۆتییە مللەتێ خۆ: هندی ئەزم ئەز پێغەمبەرێ خودێمە بۆ هەوە، ئەز ڕاستگۆییا وێ تەوراتێ ئاشکەرا دکەم یا بەری من هاتی، وئەز شاهدەییێ ل سەر ڕاستگۆییا وی پێغەمبەری ددەم ئەوێ دێ پشتی من ئێت وناڤێ وی (ئەحـمـەدە)، وئەو موحەممەدە، ڤێجا دەمێ موحەممەد ب ئایەتێن ئاشکەرا بۆ وان هاتی، وان گۆت: ئەڤا تو بۆ مە پێ هاتی سێرەبەندییەکا ئاشکەرایە.







وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (7)

سۆرانی:

**جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆی بۆ خودا هەڵبەستووە ؟ لەکاتێکدا ئەو بانگ دەکرێت بۆ لای ئیسلام و موسڵمان بوون، خودایش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی ستەمکار ناکات.**



بادینی:

**وکەس ژ وی زۆردارتر نینە یێ ژ نك خۆ درەوێ ل سەر ناڤێ خودێ بکەت، وشریکان بۆ وی د پەرستنێ دا بدانت، وئەو بۆ هاتنا د ئیسلامێ دا وپەرستنا خودێ ب تنێ دئێتە گازیکرن. وخودێ بەرێ وان نادەتە ئیفلەحێ یێن ب کوفرێ وشرکێ زۆرداری ل خۆ کری.**







يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ
وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ (8)

سۆرانی:

**ئەوانە دەیانەوێت بەفووی دەم , نووری خودا بکوژێننەوە!!
(خەیاڵیان خاوە) خودا نووری خۆی، ئاینی خۆی، تەواو دەکات و
دەیچەسپێنێت هەرچەندە کافرو بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و
پێیان ناخۆش بێت.**



بادینی:

**ڤان زۆرداران دڤێت ب درەوێن خۆ وێ حەقییێ نەهێلن یا
موحەممەد پێ هاتی -کو قورئانە- وخودێ حەقییێ دێ ئاشکەرا کەت
ودینێ خۆ پێك ئینت ئەگەر خۆ کافران پێ نەخۆش بت ژی.**







هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ
عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ (9)

سۆرانی:

خودا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە ڕێنموونیی و ئایینێکی ڕاست و دروستەوە تا بەسەر هەموو ئایینێکدا سەری بخات هەرچەندە هاوبەش پەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێ.



بادینی:

خودێ‌یە یێ پێغەمبەرێ خۆ ب قورئانێ ودینێ ئیسلامێ هنارتی؛ دا ئەو وی دینی ب سەر هەمی دینێن دی بێخت، ئەگەر خۆ بوتپەرێسان ب وێ چەندێ نەخۆش بت ژی.







يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم
مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ (10)

سۆرانی:

**ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، بازرگانیەکتان نیشان بدەم، کە لە سزایەکی بە ئێش ڕزگارتان بکات؟!**



بادینی:

**ئەی ئەوێن باوەری ئینای، ئەرێ ئەز بەرێ هەوە بدەمە بازرگانییەکا مەزن یا هەوە ژ عەزابەکا ب ئێش رزگار بکەت؟**







تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ
وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ (11)

سۆرانی:

سەرەتا باوەڕهێنانتانە بە خودا و پێغەمبەرەکەی، ئینجا هەوڵ و تێکۆشانتانە لەڕێگەی خودادا بە بەخشینی ماڵ و سامانتان، وە بەخشینی خۆتان (واتە: ماندووکردنی جەستە و بیروهۆشتان، تا بەخت کردنیان لەپێناوی خودادا) بێگومان ئەو کارەتان چاکتر و بەفرترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێبگەن.



بادینی:

کو هوین بەردەوامییێ ل سەر باوەرییا خۆ ب خودێ وپێغەمبەرێ وی بکەن، و ب وی مالێ هەوە هەی وجانێ خۆ جیهادێ د رێکا خودێ دا بکەن؛ دا دینێ وی ب سەر بێخن، ئەو بۆ هەوە ژ بازرگانییا دنیایێ چێترە، ئەگەر هوین زیان ومفایێ تشتان بزانن، هوین پێگیرییێ ب وێ چەندێ بکەن.







يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ
وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ (12)

سۆرانی:

ئەوسا خودا لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت و دەتانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە که لە چەندەها ڕووبار پێکهاتووە کە بەژێر درەختەکانیدا تێدەپەڕێت ، هەروەها کۆشک و تەلاری خۆش و ڕازاوە و پاك و خاوێن لە باخەکانی بەهەشتی عەدندا، بەڕاستی ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی و دەستکەوتی گەورە و بێسنوور.



بادینی:

ئەگەر هوین -گەلی خودان باوەران- وێ بکەن یا خودێ فەرمان پێ ل هەوە کری ئەو دێ گونەهێن هەوە بۆ هەوە ڤەشێرت، ودێ هەوە کەتە د هندەك بەحەشتان دا ڕویبار د بن داروبارێن وێ دا دچن، وئەو دێ هەوە کەتە د هندەك خانییێن پاقژ ڤە ل وان بەحەشتێن هوین هەر وهەر لێ ئاکنجی دبن، وئەڤەیە سەرکەفتنا مەزن یا چو سەرکەفتنێن دی ب دویڤ دا نەبن.







وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (13)

سۆرانی:

جا شتێکی تریش هەیە کە حەزی لێ دەکەن، ئەویش بەخشینی سەرکەوتنە لەلایەن خوداوە و ڕزگارکردنی وڵاتانێک ( مەبەستی فەتح و ڕزگارگردنی مەککەیە )، ئەو مژدەیەش بدە بە ئیمانداران (لە هەموو سەردەمێک، گەر ئیمانداران لێ ببڕێن بۆ ئاینی خودای مەزن).



بادینی:

وقەنجییەکا دی بۆ هەوە -گەلی خودان باوەران- هەیە هوین حەز ژێ دکەن ئەو ژی سەرکەفتنەکە ژ خودێ بۆ هەوە دئێت، وڤەکرنەکا نێزیکە ل سەر دەستێ هەوە پەیدا دبت. وتو -ئەی موحەممەد- مزگینییێ ب سەرکەفتنێ وڤەکرنا د دنیایێ دا، و ب بەحەشتێ ل ئاخرەتێ بدە خودان باوەران.







يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ (14)

سۆرانی:

**ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕتان هێنەوە ببنە پشتیوانی بەرنامە و دینی خودا ببینە لایەنگری پەروەردگار، هەروەکو عیسای کوڕی مەریەم بە حەواریەکانی هاوەڵی وت: کێ پشتیوان و یار و یاوەرمە بۆ ڕێبازی خودا، حەواری و هاوەڵەکانی وتیان: ئێمە ئامادەین ببینە پشتیوان و لایەنگیری خودا، ئەوسا ئیتر خەڵکی بوون بە دوو دەستەوە، دەستەیەک لە نەوەی ئیسرائیل باوەڕی هێناو شوین بەرنامەی خوا کەوت، دەستەیەکیش ڕێبازی کوفری گرتەبەر، جا ئێمەش پشتیوانیمان لە ئیمانداران کردو بەو هۆیەوە سەرکەوتنمان بەسەر دوژمنەکانیاندا پێبەخسین و زاڵ بوون.**









يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ (14)

بادینی:

**ئەی ئەوێن باوەری ب خودێ ئینای ودویکەفتنا پێغەمبەرێ وی کری، هوین ببنە پشتەڤانێن دینێ خودێ، وەکی هەڤالێن عیسای یێن نێزیك دەمێ عیسای گۆتییە وان: کی ژ هەوە دێ هاریکاری وپشتەڤانیا من د وی تشتی دا کەت یێ مرۆڤی نێزیکی خودێ دکەت؟ وان گۆت: ئەمین پشتەڤانێن دینێ خودێ، ڤێجا دەستەکەك ژ ئیسرائیلیان ب هیدایەت کەفت، ودەستەکەك د سەر دا چوو، ڤێجا مە پشتا وان گرت یێن باوەری ب خودێ وپێغەمبەرێ وی ئینای، ومە ئەو ب سەر دەستەکێن دی یێن فەلان ئێخستن، ڤێجا یێن سەرکەفتی بوونە ئەو، وئەڤ چەندە ب هاتنا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ب جهـ هات.**



# عیشق

## بۆ لەبەرکردنی سوورەتی الصف

قورئان بچێتە هەر دڵێکەوە بێگومان ئەم دڵە پارێزراوە و ئاسوودەیە و بە ئاگری جەهەنەم ناسووتێت

ئامادەکردنی : تەنیاحاجی

